دیوانی شیعر

# خرۆشان و ڕامان

علی فتاح دزەیی

١٩٨٧

دیاریێ بێ بۆ ئەو دڵانەی

کە گیرۆدەی جوانین و لێوڕێژی

خۆشەویستیی نەتەوەو

نیشتمانن

علی فتاح دزەیی

# پێشەکی

مەبەستم لەم پێشەکی‌یەدا ئەوەنیە • کەباسێکی نەزەری لە بارەی هۆنراوەو هەڵبەستەوە بنووسم ؛ یاخود لەم زەمینەیەدا، لەتاقی کردنەوەی خۆم بکۆڵمەوە • بەڵکو ئەوەندەم مەبەستە کە خوێنەر •• بەشێوەیێکی گشتی بەم کۆمەڵە هەڵبەستانە بناسێنم ، بەتایبەت لەسەردەمێکی وەهادا کە چێژگەی شعری ئەوەندە گۆڕاوە ، هەڵبەستی کوردی‌ی چەند ساڵێك لەمەوبەر بە کۆنە بابەت لەقەڵەمدەدرێ بەهەردوو باری فۆرم و ناوەرۆکەوە •

ئەم کۆمەڵە هەڵبەستە ، لەسەر دوو جۆرە کێشی شعری رێکخراون، یێکەمیان کەبەشی هەرە زۆریەتی لەسەر کێشی پەنجەی کوردی‌یەو بەشی‌دووەمیشیان ، لەسەر کێشی عەرووزی‌یە • سەردەمی هۆناندنەوەشیان ماوەیێکی درێژ دەگرێتەوە و پارچەی وەهای تێدا هەیە کە لە ساڵی ١٩٥١ دا نووسراوەو هی‌وایشی تێدا هەیە کە بەرهەمی سەردەمێکی نزیکە •

هەڵبەستەکانی بابەتی یێکەم لە سەر یەکێك لەم کێشانەوە رێکخراون :

شەش بڕگەیی (٣+٣) ، هەشت بڕگەیی (٤+٤)، دە بڕگەیی (٥+٥) ، یازدە بڕگەیی (٤+٤+٣) ، دوازدە بڕگەیی (٣+٣+٣+٣) پازدە بڕگەیی (٥+٥+ ٥)•

جگە لەمانەش لەهەندێ هەڵبەستاندا ،وەك (کارەساتی سەربەستی) و (دیسان سەربەستی) کێشێکی هەشت بڕگەیی یان یازدە بڕگەییم هەڵوەشاندۆتەوەو بەکارم هێناوە • بەڵکو ، لە دوو پارچە هەڵبەستی (یادێکی رابردوو)و(کۆچی تەمەنی لاوی)دا هیچ یەکێك

له کێشەکانی پەنجە یان عەرووزیم پەیڕەوی نەکردووەو مۆزیقای ( Rhythm ) ی شعری کێشی هەڵبەستەکانم لە سروەی مۆزیقی
فۆلکلۆری (بەیت و لاوک و حەیران) ەوە خواستۆتەوە •
هەڵبەستەکانی عەرووزیی ، ئێو ئەم دیوانەش بەشی زۆریان لەسەر کێشەکانی تەواو یان مەجزوونی ئەم بەحرانەن (رەمەل ، هەزەج،رەجەز) ئەمجا چە (مەقسور) بن و چە (مەحزووف) ، یان گۆڕانی دیکەیان بەسەردا هاتبێت • لێرەدا دەمەوێ هەڵوەستێك لە سەر ئەم دوولایەنانە بکەم : یەکەم : -
بەش بەحالی خۆم کە هەڵبەستم نووسیبێت هەرگیز لەپێشدا کێشی هەڵبەستەکەم دیاری نەکردووە • بەڵکو وەك دەڵێن کێشەکە بەخۆی خۆی سەپاندووە لام وایە ئەمەش شتێکی دەروونیەو پێوەندی هەم بەهەوالی گیانیی شاعیرو هەم بەبابەتی ناوەرۆکی هەڵبەستەکەوە هەیە • چونکە چێژکەی هونەری ماوەی شاعیرنادا کە لە کێشێکی سووك و خێرادا پڕ لە هەواڵێکی دەروونیی ماتو کزدا بکا یان ناوەرۆکێکی داستانی (مەلحەمی Epic ) بهۆنێتەوە کەچی ، بەپێچەوانەوە هەر هەڵبەستێکی پڕ لەوروژان و خرۆشانی پڕ لەشادیو خۆشی بکات ،دەبێ لەسەر کێشێکی سووك بهۆنرێتەوە راستیەکەی لەم حاڵەشدا دیسان کێشەکە خۆی دێتە پێش •
لایەنی دووەم ؛ کێشەکانی پەنجەی کوردین :
ئەوە ئاشکرایەکەلەکوردستانی عیراقدا ، شعری تازەی کوردی لە (م• نووری)و (پیرەمێرد) ەوە دەستی پێ کردووەو (گۆران)ـ گەیاندوویەتیە پلەی ئێستاکەی • کەچی ، لەم ساڵانەی دواییدا ئەم پرسیارە سەری هەڵێناپەوە : ئایا گۆران ئەم کێشانەی لەخۆیەوە داهێناون یاخود ئەم کێشانە هەبوون و ئەو سوودی لیوەرگرتوون ؟ لاموایە مەبەستی سەرەکیش لەم پرسیارەدا ئەوە بووە کە دەوری گەورەی (گۆران) لە پێشخستن و پەروەردە کردنی هەڵبەستی کوردیدا بەفۆرم و ناوەرۆکیەوە کەم بکرێتەوە •

ئەمجا بۆ حەسانەوەی ویردانی ئەدەبیم ، دەمەوێ بیروڕای خۆم
بەرامبەری ( گۆران )ی ( شاعیر ) ، بخەمە بەر چاوی خوێنەر ٠
لە ساڵی ( ١٩٤٨ ) دا ، بۆ یەکەم جار ئەم شاعیرە گەورەیەم بە
قسە کردن دیتوە ، کە لە گەڵ چەند برادەرێکی ئەو سام ( لە پۆلی
پێنجەمی ئامادەیی ) بووم ، بۆ ناسینی لە ماڵی خۆی سەرمان لێداو
زۆر بە گەرمی پێشوازی کردین ٠ لەو کاتەیشدا ، فەرمانبەری
میری بوو لە شاری ( هەولێر ) ٠
راستی‌یەکەی ، ناسیاری‌و ئاشنایی تەواوم لە گەڵیا ، لە ساڵی
( ١٩٥١ ) داو ، لە بەندیخانەی ( کەرکووك ) دا ، دەستی پێ
کردووە ٠ چەند مانگێك لەم بەندیخانەیەدا پێکەوە بووین‌و
زۆربەی کاتی رۆژو شەومان ، بە گفتوگۆ کردن ، لە بارەی
شیعری کوردی‌یەوە دەبردە سەر ٠
ئێستاش بەتەواوی دێتەوە بیرم،کە لەو ماوەیەدا ، دوو هەڵبەستی
خۆمم نیشاندا ، یەکێکیان بە ناوی ( بۆ کۆریا ) و ئەویتریان لە
ژێر ناوی ( هاوڕێم هاوڕێم ) بوو ، کە خراونەتە نێو ئەم کۆمەڵە
شعرانە ٠ هەڵبەستی ( بۆ کۆریا )م لە سەر کێشی یازدە بڕگەیی
دانا بوو ٠ دیارە کێشەکەم لە شعرەکانی ئەو ، وەرگرتبوو ٠
زۆر بەوە دڵخۆش بوو کە توانیبووم لە سەر ئەم کێشە شیعر رێك
بخەم چونکە تا ئەوسا ، هەر ئەو بە کاری دەهێنا ٠
لە بارەی هەڵبەستی دووەمیشدا ، رەخنەی ئەوەی لێ گرتم ، کە
لە لایەنی رێزمانەوە ، نابێ بڵێم ( دەڕۆن بەرەو پێش پێ‌بەپێ )
بەڵکو دەبێ بڵێم ( هەنگاو بە هەنگاو ) ٠ بەڵام هەم سەبارەت
بە قافیەو هەم لەبەر ئەوەی ئەم تەعبیرە لە هەرێمێ ( هەولێر )ێ
دروستە ، دێرە شعرەکەم وەکو خۆی هێشتەوە ٠
هەروەها ، ئەوەم لە بیرە ، کەپێم گوت زۆر لە هەڵبەستەکانی ، لە
سەر کێشی ئەو مەقام‌و بەستانەن ، کە لە کاتی شایی ، یان درووێنە
کردندا دەگوترێن ٠ لە وەڵامدا ، پشتگیری‌ی قسەکەی کردم‌و

گوتی ، ئه‌م کێشانه‌و زۆر کێشی دیکه‌ش له هه‌ڵبه‌ست[illegible]
فۆلکلۆری خوازتۆته‌وه‌و به‌کاری هێناون ، ئه‌مه‌ش [illegible]
ئه‌وه‌ی که زۆر له داستانه‌کانی له شیعره‌کانی ڕازاوه‌ [illegible]
برادەرێکی ئه‌دیبی وه‌ك ( شێخ ڕه‌ئوفی خانه‌قا — [illegible]
ڕه‌حمه‌ت چووه‌ ) ، پێی گوتوه‌ کوماڵی له‌وه‌دایه‌ که [illegible] به‌ڵام
شێوازی هه‌ڵبه‌ستی ( بۆ بلبل )و ئه‌وانیتری . له‌ مه‌قامی شا[illegible]
ده‌که‌ن هه‌تا وه‌کو شیعری شاعیران . که‌چی ئه‌وپش له‌ له‌نجام[illegible]
کێشی په‌نجه‌ی زۆر به‌که‌رمی په‌سند ده‌کرد . (١)

هه‌روه‌ها خۆی بۆمی باس کرد ، که کێشی پازده برگه‌یی . له‌
شیعری نوێی عوسمانی وه‌رگرتوه‌ .
مه‌به‌ستم له‌وه‌ی پێشوودا ، ئه‌مه‌یه‌ ، که‌ هه‌رگیز ( گۆران )
نه‌یگوتووه‌ هه‌موو کێشه‌کانی په‌نجه‌ی به‌خۆی داهێناوه‌ . به‌ڵام بۆ
ئه‌وه‌ی مافی ڕه‌وای نه‌خرێته‌ پشت گوێ پێویسته‌ ئه‌وه‌ بڵێم ، که‌
چۆن ( احمد ابن خلیل الفراهیدی ) له‌ شیعری عه‌ره‌بیدا کێشه‌کانی
( عه‌رووزی )ی سۆراخ کردوه‌و ته‌فعلیه‌ی بۆ داناون . (٢)
ئه‌وه‌هاش (گۆران) کێشه‌کانی په‌نجه‌ی له‌ شیعری فۆلکلۆریدا
ده‌ستنیشان کردوه‌و بۆ هه‌ڵبه‌ستی تازه‌ی راهێناون .
هه‌ر به‌مه‌ش وازی نه‌هێناوه‌و لێره‌دا هونه‌ری به‌رزی ئه‌م شاعیره‌
خۆی ده‌نوێنێ ، که له‌م کێشانه‌ی فۆلکلۆری‌و له‌و کێشانه‌ی که‌شیعری
کوردی‌ی پێ موتوربه‌ کردووه‌ ، زۆر کێش‌و ئاوازه‌ی نێجگار

---

(١) له‌و ماوه‌ی که له به‌ندیخانه‌ی که‌رکووك بووم ، زۆر جاران
خوا لێخۆشبوو ( شێخ ڕه‌ئووف ) بۆ دیتنی ( گۆران ) ده‌هاته‌
به‌ندیخانه‌ .
(٢) بۆ ئه‌م مه‌به‌سته‌ بنواره‌ کتێبی ( ئه‌و به‌هاری خانی )مان .

ناسکی داهێناوە ، بۆ وێنە :
بەشی هەرە زۆری بەستەو گۆرانیی فۆلکلۆری ٠
لە سەر ئەم کێشانەن :
شەش بڕگەیی (٣+٣) حەوت بڕگەیی (٤+٣) هەشت بڕگەیی
(٤+٤) و دە بڕگەیی (٥+٥) ، چواردە بڕگەیی (٧+٧) ٠
ئەمجا گۆران ، لە کێشی شەش بڕگەیی ، ئەم کێشەی دوازدە
بڕگەیی دروست کردوە : (٢+٣+٣+٢) :
بڕوانە شاییە چۆپیە لەو ماڵە [٣]
لەم کێشەش ، کێشی یازدە بڕگەیی (٣+٣+٣+٢)ی داهێناوە :
ئەی قژ زەرد ئەی بەژنو باڵای کەلەگەت [٤]
هەروەها لە کێشی هەشت بڕگەیی ئەم کێشە سێزدە بڕگەییەی
دروست کردوە کە پێنج بڕگەی خستۆتە سەری (٤+٤+٥) :

تاوانم کرد گەل پیوەی نام مۆری ناپاکی [٥]

جگە لەمەش ، لە شعری (عەرووزیشدا) ، دەستێکی باڵای
هەبوەو لەسەر گەلێك لە کێشەکانی ، شعری داناوە ٠
لێرەدا دەمەوێ لە بارەی کێشی شعری ئەم لایەنەش روون بکەمەوە
بنچینەی کێشی شعری چەندایەتیو چۆنیەتیی رێز کردنی بڕگەی
دەنگە لە دێڕە شعرێکدا ، کە لەرەی کێشەکە دەدەنەوە ٠ بۆیێکە
زۆر کێشی پەنجەیی کوردی هاودەنگو لەرەیان لە کێشەکانی
عەرووزیدا هەیە وەکو :

---

٣ ــ هەڵبەستی (گوڵی خوێناوی)
٤ ــ هەڵبەستی (دوا سرنج) ٠
٥ ــ هەڵبەستی لە بەندیخانە ٠

کێشی حەوت بڕگەیی (٤+٣) ، هـاو ئاهەنگی کێشی (هەزەجـی مەجزووئو مەحزووفە، کە ئەمە تەفعیلەکانیەتی: (مفاعیلن فعولن) کێشی یـازدە بڕگەیـی (٤+٤+٣) ، هـەم هـاو لەرەی کێشـی ( رەجەزی مەقتووعو مەخبوون ) • کـە ئەمـەیە تەفعیلەکانـی (مستفعلن مستفعلن فعولن) و هەم هاو ئاهەنگی کێشی ( سەریعی مەکشـووفو مەتوی ) یە ، کـە ئەمانەن تەفعیلەکانی (مستفعلن مستفعلن فاعلن) • هەروەها ،کێشی دوازدە بڕگەیـی (٣+٣+٣+٣) ، هـاو لـەرەی کێشـی (موتـەداریکـی تـەواو المدارك التام )ە • کە تەفعیلەکانی ئەمانەن ( فاعلن فاعلن فاعلن فاعلن) ، بێجگە لەمەش، بۆی هەیە شارەزاکانی شعری نەتەوەکانی موسولمانو شعری نەتەوەکانی رۆژ ئـاوا بتوانن لە کێشەکانـی شعری ( Meterical Rhythm, )ی ئەم نەتەوانەو لـە کێشەکانـی شعری نەتەوەکانـی پێشتردا ، چەعەرووزی بنو چـە پەنجەیـی هەندێك لەرەی بنەڕەتی بدۆزنەوە کە هاو ئاهەنگی یێکتربن •

بـۆ وێنــە :

بێ ئەوەی هیچ شارەزاییم دەربارەی زانیاری عەرووز ( Prosody, ) ی شعری رۆژ ئاوایی هەبێ ، شاعرە کۆنەکانمان گوتەنی ، هـەر بە سەلیقەی شعری هەست دەکەم کە کێشی هەڵبەستی :

( The charge Of The Light Brigade )ی

شاعری گەورەی ئینگلیز ( لـۆرد تەنیسۆن : ١٨٠٩ ــ ١٨٩٢ ) ، هاوئاهەنگی کێشی حەوت بڕگەیی فۆلکۆریمانە ، کە ( گۆران ) ، لە هەڵبەستی بەناوبانگی ( بـۆ بلبـل ) یدا . بەکـاری هێناوە ، ئەمەش وەکو لە پێشەوەدا باسـمان کردووە هـاو لەرەی کێشـی ( رەجەزی مەجزووئو مەحزووف ) ی عەرووزی‌یە •

بۆ چەسپاندنی ئـەم بۆ چوونە ، چەند دێرێـك شـعری فۆلکلۆری دەخەمە بەرچاو کە لە مەقامێکی دروێنەی دەشتی هەولێر ، بەتایبەت خێلی (دزەیی) وەرم گرتووە ، بەرێکەوت ناوەرۆکیشی کەمێك لە

ناوەرۆکی هەلبەستەکەی (لۆرد تەنیسون )دەکا • :

« لە شەمزینان هات خەبەر
پێنج سەت سوارن بەدەفتەر
کانەبی‌یە سەر عەسکەر
یاخوا نەمری کانەبی»

دێری چوارەم ، بە درێژایی هەلبەستەکە ، هەمیشە لە دوای سێ دێری هاوقافیەوە دەگوترێتەوە •
ئەمەش چەند دێرێك لە ستانزایێکی هەلبەستەکەی ئینگلیزی‌ی ناوبراوە ؛

Theirs not to make reply
Theirs not to reason why
Theirs but to do and die
Into the valley of death
Rode the six hundred, • ;;

لە بارەی تەکنیکی قافیەکاریشدا ، (گۆران) بە فۆرمەکانی شعری ئینگلیزی ، فۆرم و قالبی شعری کوردی‌ی تازە کردۆتەوە • بۆیێکە لە دەفتەری شاعیرانی کورددا ، هەمیشە شوێنێکی تایبەت و لاپەڕەیێکی تایبەت بۆ ناوی ئەم شاعیرە گەورەیە تەرخان دەکرێ•
بگەڕێمەوە سەر ناساندنی ئەم کۆمەڵە شعرە :
کو هەلبەستەکان لەسەر کێشی هەمە جۆری پەنجەو عەرووزی رێکخراون ئەوەهاش بابەتی قافیەکانیان هەمە جۆرە،قافیەش تەکنیکێکی هەرە گرنگی شعرو هەلبەستە هەم لە شعری نەتەوەکانی موسولمان و هەم لە شعری نەتەوەکانی رۆژ ئاوادا •

ئەگەرچی نەتەوەکانی خۆر ئاوا بابەتی شعری بێ قافیە (بلانک ڤێرس : Blank Verse ) یان لە کەلەپووری شعری یۆنانی کۆنەوە بۆ ماوەتەوە ، ـ ئەلیادەو ئودیسە ـ بێ قافیەن هێشتا تەکنیکی قافیەکاری روخسارێکی نێجگار نازداری شعری ئەم نەتەوانەیە ٠

دیارە بنچینەی قافیەش هەر لەرەو مۆزیقای دەنگی دواپیتەکانی وشەیەو لەم بارەوە لەگەڵ کێشدا یەك دەگرنەوە ٠

ئەو وشانەی کە پیت لە زمانەکانی نەتەوەکانی موسولماندا ، هەمیشە لەرەی و نیشانەکانی بزوێنی دووایەوەیان وەکو یێکن ، بە قافیەی دەنگی درکاندنیان وەکو یێکتر دەبێتو دەشێ بکرێن دوو میسراع یان دوو بەیتی شعر ٠

کەچی لە زمانەکانی زۆرلەنەتەوەکانی خۆر ئاوادا ووشەی واهەن کە پیتەکانی دوواوەیان وەکو یێکن ، بەلام لە درکاندندا هاودەنگی یێکتر نین ، وەکو ئەم دوو ووشانەی ئینگلیزی ( Kind ) و ( Wind ) کە پیتەکانی دووا وەیان وەکو یێکن بەلام شێوەی درکاندنیان جودایەیێکەمبە ( وند )و دووەمیان بە ( کایند ) دەخوێندرێتەوە ٠ بە پێچەوانەی ئەمەش ، ووشەی ( Breeze )و ( Please ) ، پیتەکانی دواوەیان لە یێکتر جیاوازە ، کەچی لە درکاندا هاودەنگی یێکترن و بە (پلیز) و ( بریز ) دەخوێندرێنەوە ئەمجا ، ئەگەر دوو وشەکانی پێشەوەتر ، قافیەی لاواز بەدەستەوە بدەن ، ئەمانەی دوواییی ، قافیەی زۆر توندو مەحکەم پێکدەهێنن٠

سەررای ئەمەش تەکنیکی قافیەکاری ئەوەندە گرنگە شعری هەموونەتەوەکانیناوبراو بەگوێرەی دامەزراندنی قافیە( Rhyme ) لە هۆنراوەکاندا دەکرێ بە چەند بابەت ٠راستی یەکەی شعرەکانیان لە سەر بنچینەی ئەم سێ چەشنەی قافیەکاری دامەزراوە :

١ ـ دووانی = مەسنەوی (Couplet) کە ئەمەیە قافیەکانی( AA )٠

٢ ـ سێیانی = ( Tercet ) ٠ که قافیه‌کانی بەم جۆرەیە ( ABA ) ٠
٣ ـ چوارینی = ( Quatrain ) که سێ شێوەی قافیه‌کاری هەیە :
ا ـ چوارینی‌ی بالاد ( Ballad ) ی ئینگلیزی، که ئەمەیە قافیه‌کانی ( ABCB ) ، و ٠
ب ـ چوارینی ئینگلیزی ( شەکسپیری ) ، کە قافیه‌کانی بەم جۆرەیە ( ABAB ) و ٠
ج ـ چوارینی‌ی ئیتالی ( پەترارکی ) ٠ کە شێوەی قافیه‌کانی ئەمەیە ( ABBA ) ٠

ئەمجا لە چۆنیەتی تێکهەلکێشانی ئەم بابەتانەی قافیه‌کاری ، ستانزا ( Stanza ) ی شعری دروست دەبێت ، کە بنچینەی فۆرمی سۆنێت ( Sonnet ) و ئۆد ( Ode ) و ئیترە ٠

لە شعری نەتەوەکانی موسولمانیشدا ، تەکنیکی قافیه‌کاری هەمان بایەخی هەیەو بەڵکو زۆر پتریش ٠ چونکە لە بنەڕەتا ئەم نەتەوانە شعری بێ‌قافیه‌یان هەر نەبوەو بەڵکو هۆنراوی بێ‌قافیه هەر بەشعریش نانلن ٠

دیسان لێرەشدا فۆرمی هەڵبەستو هۆنراوە لە چۆنیەتی‌ی دامەزراندنو ریزکردنی قافیه‌کانی هەڵبەستەکە دروست دەبێت و ناوی تایبەتی وەردەگرێت کە ئەمانەن :

١ ـ قەسیدەو غەزەل : هەموو بەیتەکانیان هاوقافیه‌ن ٠
٢ ـ مەسنەوی: که ئەمەیە قافیه‌کانی (اا ا) ٠
٣ ـ چوارینی : کە قافیه‌کانی بەم جۆرە دەبێ (اا ب ا) ٠
٤ ـ پێنج خشتەکی، کە قافیه‌کانی بەم چەشنەن (اااا ب ، دددب) دیارە شەش خشتەکی‌و ئیتریش ٠ هەر لەم بابەتەنە ٠
٥ ـ موستەزاد ، کە ئەمە ، بابەتێکی گرنگی قافیه‌کاریتی (اب اب جج اب ، دد اب) ٠٠٠
٦ ـ تەرجیعات : ا ـ تەرجیع‌بەند کە ئەمەیە وێنەیێکی قافیه‌کانی (ااااااجج ، ببببببجج)

ب ـ تەرکیب بەند ، کە قافیەکانی وەکو تەرجیعبەندە ، بەلام قافیەی بەیتی تەرجیعی دەگۆڕێ .

٧ ـ موسەممەت کە بەم چەشنە دەهۆنرێتەوە (اااا،ببب ا ،دددا)و میسراعەکانی دەکرێن بە دوو کەرتی قافیەدار .

٨ ـ (مووەشەح) ، کە موسەممەتێکی لێکدراوەو ئەمەش وێنەیێکی قافیەکاریتی :

اااا مس

ب ب ب ب مس

د د د د مس

مەبەستی سەرەکیم ، لەم درێژە پێدانە ئەوەیە ، کە شاعیرە گەنجەکانی کورد ، ئاگاداری ئەم دوولایەنەی هونەری شعر بین، هەم لەباری کێش‌و هەم لەباری قافیەکاریدا ، شعری کوردیش ، جۆکەلەیێکەو لە دەریاری بەرینی شعری جیهانی دەکاتەوەو دەبێ نموودو روخسارەکانی ئەسلی‌ی ئەم هونەرەی پێوەوە دیاربێ .

هەلبەستەکانی نێو ئەم دیوانەش ، لەسەر زۆر شێوەی قافیەکاریدا رێکخراون ئەمجا چە خۆمانەی خۆر هەلاتی بن و چە فۆرمی رۆژ ئاوایی .

ئەو هەلبەستانەی کە قافیەکانیان ناکەوێتە بەرچاو لەبەر ئەوەیە ووشەکانی هەندێ دێڕەکانم لە یێکتر ترازاندوە گەرهات‌و وشەکان خرانەوە شوێنی خۆیان ئەوا قافیەی دێڕ یان بەیتە شعرەکە بەدیار دەکەوێتەوە .

ناوەرۆکی هەلبەستەکانیش پێویستی ، بە لێوە دوانێک هەیە . بەشی هەرە زۆری هەلبەستەکان ، ویژدانین ، ( Lyric ) بەواتای ئەوەی کەبڕ لە وروژانی هەستی دەروونیم دەکەن ، لەکاتی هۆنینەوەیاندا ، ئەمجا هەرچی بێت هۆی وروژانەکە .

هەروەها هەلبەستێکی شانۆگەریشی تێدا هەیە ، جگە لەمانەش، زۆر پارچە هەلبەستی ئەوتۆی تێدا هەیە کە پڕ لە ڕامانی فکریم دەکەن ، هەرچۆن بێ باری رامانەکە ٠
بێگومان ، هەڵبەستەکان بەرهەمی ماوەیێکی درێژی شعر دۆستیمن‌و لە نێوانی هەندێکیاندا ماوەیێکی زەمانیی سی سالی هەیە ٠

چەند ئاواتە خوازی ئەوەم کە لە کاتی دانانیاندا مێژوو و سەر دەمی هەر پارچەیێکیانم دیاری بکردایە ٠ ئێستاش کە ئەم ئاواتە هەرگیز نایێتەدی‌و بۆ ئەوەی خوێنەر ئاگاداری جیهانی بیرو عاتیفەی خاوەنی شعرەکان ببێت ، ناچارم کە تەمەنی شعر- نووسینم بەسەر سێ قۆناغدا دابەش بکەم ٠

راستی‌یەکەی هەرلە زوێکەوە لەمەراقی شعروهەلبستەدا بووم‌لەسالی (١٩٤٣ ـ ١٩٤٤) کە لە پۆلی یێکەمی ( ناوەندی ) بووم ، زۆر پارچە شعری (حاجی قادرو تاهیربەگ‌و ئەدەب‌و وەفایی‌و نالی‌و شێخ رەزاو موخلیس ) م
لەبەر بوو هەتا جار بەجار مەشقی شعر دانانیشم دەکرد ٠ لە سالی ( ١٩٤٦ ) بەدواوە لە زۆر موناسەباتاندا بە پێی توانایی ئەو سام شعرم نووسیوە ٠ بەداخەوە هیچ نموونەیێکی شعری ئەو سەردەمەم نە لەلاماوەو نە لەبیرماوە ٠ ئەوەندە هەیە ، کەسێ موناسەبەتم وەبیر دێنەوە یێکەم ئەوەبوو کە لە سالی ( ١٩٤٦ )دا ئامۆزایێکی زۆر خۆشەویستم (ئەنوەر حوسێن مەلا) کە قوتابیی پۆلی یێکەمی کۆلێجی حقووق بوو ، لە کاتی وەرگەڕانی ئوتومبێلەکەیاندا جوانە مەرگ بوو و هەڵبەستێکی شیوەنم بۆ رێکخستبوو ٠

دووەم موناسەبەت ئەوە بوو لە هەمان ساڵدا لاوێکی دڵسۆزو

کورد پەروەری هەولێر ( عمر عوسمان )[١] جوانە مەرگ بوو و ، لـە کاتی ناشتنیدا هەڵبەستێکی لاواندنەوەم کـە بـەم بۆنـەوە نووسیبوو خوێندمەوە ٠
سێ یەمیان ئەوە بوو کە لە ئاهەنگی گەورەی نەورۆزی سـاڵـی ( ١٩٤٧ ) دا هەڵبەستێکم پێشکەش کـرد ٠
هەڵبەت هەر هەڵبەستێکی لەو تەمەنەمدا نووسیبووم لـە چـوار چێوەی شـعری تەقلیدی دەرنەچوو بـوو و سەرەڕای ئەوەی کـە مۆری زاراوی هەرێمی هەولێرو بە تایبەت خێلی ( دزەیـی )یان پێوە دیار بووە ٠
ئێستاش ، لـە پێپلکانەی تەمەنی پەنجاو شـەش سـاڵیمدا کـە تەماشای سـەردەمی ئەوسای ژیانم دەکـەمەوە وەکـو جیهانێکی تەماوی و تەلەسماوی لە پێش چاوی خەیاڵمدا خـۆی دەنوێنێت‌و هەزار چەشنە پرشنگی رەنگاو رەنگی تێدا دەدرەوشێتەوە ٠
لەو سەردەمەدا لە گەڵ تەووژمی سروودەکانی نەتەوەیی خوێنـم دەهاتە جۆش‌و لە گەڵ بەستەی ( شەمامەو شەمامە )دا باڵم دەگرت و لەگەڵ بەندەکانی ( مـەم و زین )و (سـیامەندو خەجـێ )دا مات‌و کز دەبووم‌و لـە گەڵ رمبەی دەهـۆڵ‌و فیقـەی زورناش‌دا ئەسپی ئاواتم تاودەدا ٠
هەتا مابم لەسەر پەردەی بیرەوەریمدا یـادی ئەو رۆژە خۆشانـە هەرگەش دەبن کەلەگەڵ برادەرەکانی هاوتەمەندا لەسەرو چاوەی کارێزی (تووڕەق) ئاهەنگی نەورۆزمان دەگێڕا ٠
هەتا ماویشم بیرەوەریی ئەو گەشتە هـەر زیندوو دەبێ کە لـە پشووی نیوەی ساڵی (١٩٤٥)دا لـە ژێر چاوەدێریی (مامۆسـتا مووسا سەمەد)دا بۆ (بەغدا) و (کەربەلا) کردمان‌و نوێنمان لەنێو

---

١ ــ برا گەورەی ( مامۆستا حیدر عثمان شێرزاد ) بـوو ٠

فارگۆنێکی باری شەمەندەفەردا رادەخست و (رەئووفی چایەچی-خوا لێخۆشبوو سەماواری دەجۆشاندو برادەرە دەنگ خۆشەکانیش سەرگەرمی بەستەو سروودیان دەکردین • خواردەمەنیی هیچ چێشتخانەیەکی تازەبابەت تام و بۆی ئەو بابۆلانە (ـ لەفە) نادەن کە لە دووکانەکانی سەر سەکۆی ئێستگاکانی شەمەندەفەردا دەمان کڕین •

زۆر جاران ئەوەم بەبیردا دێ : بلێی راست بێ دەم و کاتی ئەوەندە خۆشم بەسەر بردبێ و ئیتر تامردن بەحەزرەتیانەوە دەبم ؟ یاخود راستە جارێکی دیکە لەگەڵ زۆربەی برادەرەکانی ئەوسام چاومان بەیەکتر ناکەوێتەوە ؟

هەر لەهەمان سەردەمدا فێری خوێندنەوەی کتێبی عەرەبی بووم و بەباوەشی (روایات الجیب)م کۆدەکردەوەو کتێبەکانی (مصطفی لطفی المنفلوطی)و (احمد حسن الزیات)و (احمد الصاوی محمد)م لە ئاسمانا دەقوازتنەوە• گەلێك فرمێسکی گەرم و گوڕم بەسەر لاپەڕەکانی ( ماجدولین )و ( پولو فرجینی )و (رافائیل)و ( آلام فرتر )دا رشتوە • سەد ئەوەندەی ( ستیفن )و (پۆل)و (رەفائیل) و (ڤێرتەر) گیرودەی (ماجدۆلین)و (فرجینی)و (جۆلیا)و(شارلۆت) ببووم • (شیللی)و (بایرۆن)یش دەرگایێکی تازەی جیهانی شعرو خەیاڵاتی رۆمانسییان بۆ دەخستمە سەرگازی پشت • ئەم جیهانەی سۆزوخەیاڵاتی رۆمانسیش . هەتا ماوەیێکی دوورو درێژی لەمە بەدوواوە هەوێنی هەست و عاتیفەی شعریم بوو[٦] لە ساڵی (١٩٤٩) لە پۆلی یێکەمی کۆلیجی حقووق بووم لە (بەغدا)

---

٦ ـ( ماجدولین و ، پول و فرجینی ) وەرگێرانی ( المنفلوطی ) ن •
( رافائیل )و ( آلام فرتر ) وەرگێرانی (الزیات)ن و (شیللی)
و (بایرون) یش دوو کتێبی ( احمد الصاوی ) ن •

كە ڕێگام كەوتە بەندیخانەكانی (بەغداو كووت و كەروك) .
ئەم گەشتە ناچاری‌یەم سێ ساڵی‌خایاند بەڵام وانەبێ سوودم لێوە
نـــەدیبێـت ·
لەوماوەیەدا ، جگە لە كتێبی جۆراو جـۆر ، گەلێك لەبەرگەكانـی
گۆڤاری ( گەلاوێژ )م پەڕ بە پەڕ خوێندەوە · هەروەها لە سایەی
چیرۆكـە خۆشـو ئاسانەكانی خـانمی ئەمەریكـی ( پێرل‌بەك )
تـاڕادەیێـك فێری خوێندنـەوەی ئینگلیزی بـووم بەیـاریدەی
فەرهەنگ سەرتاپای كتێبی : لە چیرۆكەكانی شەكسپیر ( Tales
From Shakespeare )م خوێندەوە كە كورت كردنەوەو داڕشتنەوەی
(چارلس لامب‌و ماری‌لامب)ی برارخوشكن ·
دوو پارچە هەڵبەستی ئەو سەردەمەی شعر نووسینم خستۆتە نێو
ئەم كۆمەڵە شعرانە · باری رامانی بیرو سۆزی عاتفی‌ی ئەم دوو
هەڵبەستەش هەر چۆنێك بووبن ، دیسان بە درێژەپێدانی قۆناغی
یێكەمی شعر نووسینی خۆمیان دەزانـم ·
قۆناغی دووەمی شعر دۆستێم لە ساڵی ( ١٩٥٣ ) وەدەست پێ
دەكا· كە بۆ خوێندن‌بۆ( دیمەشق ) چووم و لە ساڵی ( ١٩٥٨ )دا
كۆتایی دێ كە خوێندنی ( حقــووق )م لەوێ تەواوكرد · دیـارە
قۆناغی سێیەمیش ، لەم ساڵە بە دوواوەیە ·
لێرەدا ، زۆر لەلام گرانە ، سەردەمی ئەو چەند ساڵانەی ژیانم‌لە
( دیمەشق ) دەستنیشان بكەم بێ ئەوەی یادێكی گەرمی ئەو كوردە
دڵسـۆزانە بكەمەوە كـە هەتامردن شـانازی بەدیتن‌و ناسـینیان
دەكەم · كەسانی وەكـو ( رەوشەن خانـم بەدرخان ) و ( دكتـۆر
نوورەددین زازا )و ( قەدری بەگ جەمیل پاشا )و(مەمدووح بەگ
سەلیم)و ( حەسەن ئاغای ئاغای حاجۆ ئاغا )و ( ئاپۆ عوسمان سـەبری )
و هەر دوو شاعری هێژا (قەدرجان‌و جگەر خوێن) كە سەربردەی
ژیانی هـەر یەكێكیان لاپـەڕێكی گەشـە لـە داسـتانی خەبـاتی
نەتەوەییمان و دەرگایێكی داخراوی مێژووی میللەتەكەمانیان بۆ

دەکردمەوەو تەووژمو گوڕێکی تازەیان بەهەستی نەتەوایەتیم دەبەخشی • ئەمجا منیش ، بۆ بیرەوەریی ئەو سەردەمەی ژیانم مەگەر وەکو نووسەری گەورەی فەرەنسایی خانم ( سیمون دو بووڤوار ) بڵێم : یادگارەکانی ئەو کاتانەش لە وانەن کە تاکو مردن لەلام شیرین بن‌و هەتا ڕکیشم لەم خەیاڵە دەبێتەوە کە رۆژێك لە رۆژان ئەو یادگارانە لە گەڵما بۆ ژێر خاك دەچن‌و نامێنن •

پێش ئەوەی کۆتایی بەم پێشەکییە بهێنم ئەوە رادەگەیینم کە لە شعر نووسیندا ( هەوادار ) بووم نەك ( پیشەکار ) . واتا ، هەریەکێك لەم هەڵبەستانە ، زادەی ورووژانێکی دەروونی یان جۆش‌و خرۆشێکی دڵ یا رامانێکی بیرن کە وەکات یاخود لە دووای ماوەیێکدا بڕیان لێوە کردوون • هەر بۆیێکە ئەم هەڵبەستانەو ئەوانەی کە فەوتاون بەرهەمێکی کەمی ئەو ماوە درێژەی شعر دۆستێمن •

هەندێك لەم شعرانە ناو بەناو بڵاو کراونەتەوە کە بۆ چاپ کردنیش ئامادەم کردن ، دەستکارییێکی زۆر کەمی چەند پارچەیێکم کردۆتەوە •

ئەمجا سەبارەت بەوەی کە هەڵبەستەکان یان بڕ لە خرۆشانی دەروونی دەکەن‌و سەدای خورپەی دڵ دەدەنەوە ، یاخود رەنگی رامانی بیر دەڕێژن لە بارەی هەندێ هەڵوێستی بنەڕەتی لە ژیانی مرۆڤدا ، دیارە بەم مەبەستەوەیە کە ناوی ( خرۆشان‌و رامان )م، بۆ ئەم دیوانە هەڵبژاردووە •

هەروەها چونکە شعرەکان لە سەر دوو بابەتی کێشی سەرەکی رێکخراون بە پێویستم زانی کە پێڕستێکی تایبەتیش بۆ ئەوانەی سەرکێشی عەرووزی دابنێم • ئیتر ئەمەیە دیوانەکە :

علي فتاح دزەیی
هەولێر : ١٩٨٥/٧/٢٧

## تێبینی :

بۆ نووسینی ئەم پێشەکی یە سوود لەم سەر چاوانە دیتراوە :

١ ـ دیوانی گۆران
٢ ـ فن الشعر ـ ارسطاليس ـ ترجمة الدكتور عبد الرحمن بدوی طبعة القاهرة ـ سنة ١٩٥٣
٣ ـ توضيح العروض ـ اميل جورج عبيد ـ طبعة حلب
٤ ـ تاريخ الادب في ايران من الفردوسى الى السعدى .
أ . كـ . براون . ترجمة الدكتور ابراهيم امين الشواربى .

5 — An Introduction To Poetry ...... Jacob korg ...... ... ...

6 — A Hand Book For the study Of Poetry , Lynn Altenbernd And... Leslie L , Lewis

7 — The Prime Of Life : Simone de Beauvoir, translated, by Peter Green , P , 312

8 — Poems Of Alfred Lord Tennyson Selected By , Charles Tennyson P, 454 — 456

## لـه گـەڵ ڤالنتینـا

(لەشەمەندەفەری توورووس ـ لەنێوانی مووسل و حەلەبدا

سالّی ١٩٥٥

شـەمەندەفەر خـوایە هـاوار هەنـد سست بـێ
مەودای دوازدە مـانگە رێگـای یێـك بست بـێ

لـە كـابینەی تـەنیشـت هـی مـن میـوانـە
كچێكـی شـۆخ رەنگـڵو شێـوەی بێگـانـە

مـن تـەنیـامو ئـەو تـەنیایـە،رێ!دوورە،
هـاوینە كـابینەی تـەنگـڵ وەك تـەنـدوورە

لـە كـۆ ڕیـدۆر وەسـتان،لـە پێشـی پەنجـەرە،
هـەوای فێنـك دەرمـانـی دەردی سـەرە

ـ : هێـوارە باشـی ، چۆنـی رێبواری جیـران ؟
ـ : هێوارەی تۆش فەرموو جێی من خانم گیان ،٠٠

بەخۆت چۆنی ؟ خەڵکی کوێی واشیرینی ؟
ـ : ئەمریکانم ، ئەمەریکای لاتینی

خەڵکی پیرۆم ناوم ڤالنتینایە
قوتابیم ، بەرنامەم مێژووی دنیایە

ویستم ئەوەی لە کتێبدا دەیخوێنم
جێگاو شوێنی بە چاوی خۆم ببێنم

ئەدی تۆ ؟ ـ : من کوردێکی کوردستانم
وەك تۆ بۆ خوێندن گەڕیدەی شارانم ٠

ـ : تۆ کوردی ؟ هاو خوێنی سەلاحوودینی ؟
ـ : بەڵێ هاو خوێنێکی ئەوە ، دەیبینی ٠

ـ : توخوا ێیك پسیارم هەیە بڕوانە ٠ ٠ ٠ ،
راست پێم بڵێ : چۆن پرچێکت لاجوانە ؟ !

«کچە کورتە بالای رەنگ زەرد ـ ئەسمەر بوو»
پرچی رەش ، شێوەی شیرین ، وەك شەکەر بوو ،

پیاو لە دوور بیدیتبایە دەیگوت : رەسمە ؛
یان خەیاڵەو زادەی سیحرو تەلەسمە ٠»

گوتم : خانم سوێندبی بەم چاوە جوانە
بۆ پرچی وەك هی تۆ جەرگم بریانە ٠

کوتی : ئـا ، تۆش وەك سولتان پرچی زێرین
دیلت دەکا ، یان هەمزەی دوو چاوی شین

کوتم : ئەی قوتابیی یەکسەر ماموستا
ئەی شارەزای مێژووی چوار گۆشەی دنیا

ئەم باسە لەکام کتێبدا نووسراوە ؟
چۆن ؟ کەی ؟ لە گەڵ کام شۆخێکدا روویداوە ؟

گەر چیرۆکی تەلیسمانت مەبەستە (١)
وەك ئەفسانە لە سەدایێکی راستە

سەلاحوددین ویستی پتر خوێن نەڕژێ
تا هەتا ئینسان برای ئینسان نەکوژێ

ئەو سولحەی کە لەگەڵ ڕێکاردۆس کردی
رازاندیەوە بە دەستوورێکی کوردی

(٢)
مەلیك عادل ، خوشکی شای فەرەنگ بینێ
خوێن تیکەڵ بێو دوژمنداری نەمینێ

بەڵام کەنیسە ڕێی نەدا ئیش وابێ
رۆژ ئاوا بووك بێو رۆژ هەڵات زاوابێ

ئەو رووداوە ، چۆن بۆم باسکردی وایە
ئێستاکەش من ، ئەمەم بیرو بڕوایە

فەرموو گوێ بگرە چۆرپەی دڵ ، ئیسپاتە
خوێنیان گەرمە خەڵکی ئەم رۆژ هەڵاتە

گوتی : ئای چەند قوتابییێکی فێڵبازی
چاک دەزانم لەدڵدا چی دەخوازی

دەی فەرموو گەردەتوانی جانتاکانم
دانی ئەم شوێنە بەرزە من ناتوانم

○

دایوەشێنە کابرا شانی بەتۆزت
بەس جلەو شل کە بۆ بیری ئالۆزت

شەو درەنگە ، ماندووی رێگای ، پاڵ کەوە
ئێستا دراوسێی ئازیزت تێر خەوە

○

شەمەندەفەر ! ئەی ئالەتی نابینا
بۆچ هێندە زوو درابیت بەم گەشتەم هێنا ؟

بەم بەیانی وەختە ، هەتا نەمتوانی-
بڵێم : خوات لەگەڵ جوانەی ئەمریکانی

○

خۆزیا ، خوایە ، شەمەندەفەر ، هەند سست با
مەودای سەد ساڵە رێگای ، یێک ئەنگوست با

هەتا هەتــا ڤـالنتینـام جیران بــا
جـانتاکـانیم شـەوو ڕۆژ لـەسـەر شـان بـا

٥

١ ــ Talisman : چیرۆکێکی خەیاڵیی ( سێروالتەر سکۆت )ە لە بارەی سۆلتان و شەڕی سـەلیبی ٠

٢ ــ یەکێك لە پێشنیارەکانی ئاشتی ئەوە بوە ، کە (مەلیك عادل) ی برای (سۆلتان) شازادە (جوانا) ی خوشکی (ڕێکاردۆس ــ ی ــ شێردڵ) بهێنێ کــە بێوەژنی شای دوڕگەی (سەقلیا) بووو، هەر دوویان بکرێن بە شاو شاژنی فەلەستین ٠ بـەلام جیاوازی ئایینیان بوو بە کۆسپی ئەم پێشنیارە ٠

## کاری دلداری

دەمێك بوو چاوەڕێی هاتنی بەهار بووم
ئومرەك بوو لە چلەی زستانم بێزار بووم

لە تاڵی لاوێما ژیانم زستان بوو
خۆشترین ڕۆژێكی ڕەهێڵ و زریان بوو

لە ئاسۆی هیواما نەمدەدی ڕۆناكی
تاریك بوو ژیانم شەوو ڕۆژ سەرپاكی

تەنیا بووم بێ دۆستو بێ یارو بێ هاو دڵ
بە دڕكم دەزانی جوانترین خونچەی گوڵ

نەچووكەی باڵدارێك نە ، نەغمەی شمشاڵێك
نەشئەیان پێ دەدام ئەوەندەی تۆسقاڵێك

ئەمە بوو هەواڵم ئەی نووری چاوانم
تا وەك خۆر سەركەوتی لە ئاسۆی ژیانم

دەركەوتی و تاریكیی ژیانم بەسەر چوو
تاناخی دەروونم وەكو ڕۆژ ڕۆناك بوو

ئێستاكە ئەم دڵەم ئەوەندە بینایە
چەند جوانیی بزر هەن لەم كەونو دنیایە

هەموویان دەبینیو بۆ گشتیان دەنواڕێ
گشتی لا نازدارن وەك گوڵی بەهارێ

ئێستا کە ئەوەندە کوێی سووکە ئەم دڵە
بەخشپەی مێروولەو بە فڕەی پەپوولە

هەست دەکاو دێتە جۆش دەکەوتە هەڵپەڕین
بانگ دەکا ئەمانەن نموونەی سادەی ژین

•

بەهارە ژیانم ، نەورۆزە بەهارم
دەمەوێ هەڵپەڕم هاوارکەم : دڵدارم

دڵداری چاوی تۆم ئەوەندە دڵشادم
ئەوەندە سەربەستم ئەوەندە ئازادم

دەتوانم ئاوازەم خۆشتر کەم لە شمشاڵ
لە باڵدار بڵندتر هەڵفڕم بەبێ باڵ

ئەوەندە لە جۆشی عشقتدا بە تاوم
دەمەوێ ئەم گەونە دانێمە سەر چاوم

دەمەوێ ماچ بکەم ئەم ئەرزو ئاسمانە
بگرمە باوەشم ئەم هەموو جهانە

## بۆ شۆخێکی (ن ٠٠٠) ناو ٠

دیمەشق ـ ١٩٥٧

ئەو نازدارە کێ دەبێتە هاوڕازی !
کێیە خوایە قیبلەی هیوا و نیازی ؟

کام خوا پێداو کام بەختیار ئەو جوانە
سەیری دەکا بەم دوو چاوە کەشانە ٠

بۆی لێدەدا دڵی سەر چاوەی پاکی
پێی دەبەخشی دنیای پڕ لە ڕۆناکی ؟

ئەو نازدارە کێ دەبێتە هاوسەری
ئادەمیزاد ! یاخود شازادەی پەری ؟

چاو دەگێڕم بەم شارەدا سەرانسەر
کەس نابینم بشێ بۆی بێ بەهاو سەر

کەسێك نیە لە ناسیارو بێگانە
بخرێتە نێو تا تەرازووی ئەو جوانە

ئەو خوو و ڕەووشت بەرزەی ئەریستوکراتە
ئەو نموونەی جوانیی ئەم ڕۆژهەڵاتە

ئەی نازەنین، ئەی فرشتەی ئاسمانی
دەتپەرستم بەبێ دەنگی و پەنهانی

لە نێودلما دەتپەرستم بە ماتی
دلدارێکم گیانم تۆیە ئاواتی

لێم ببوورە گەر کەمێک بەد رەووشتم
جۆشی دڵ بوو ئەم رازەی پێ هەلڕشتم

وەگەرنا من، هەر ئەوەندەم نیازە
ئەو دوو چاوەی پڕ لە تەلەسمو و نازە

رۆژێ جارەك بۆلای من هەڵیا نیێنی
شادە دێنم کە هەر خۆت حۆری عەینی

لەم شارەی کە، بەبهەشتی دانـاوە
(شەوقی) ئەو شاعری گەورەو بەناوە

# گوڵپەی خۆشەویستی

لەگەڵ هەزار شۆخاندابی ، نازداری
لە نێو هەزار گوڵاندابی . بەرچاوی
لە پشتی سەد دەرگای ئاسن لێم دیاری
لەودیوی سەد کێوان بی . وەك هەتاوی

چاوەکانی هەمیشە پڕ پسیارت
کە بۆ رازی ناخی دڵم دەڕوانن
لە نێو چەپکی رەنگاو رەنگی روخسارت
دوو نێرگزی تێر بەفراوی کوێستانن

نەخشی رووی تۆ واچەسپاوە لە یادم
خۆشەویستیت گڕی بەرداوتە خوێنم
وەك سوریدی رێگای عشقت بەر بادم
فەنای تۆم و بەهێوای تۆ دەمێنم

هەر دوو یەکین یەك هەبوون و یەك بیرین
یەك قوڵپی خۆین بەلەشماندا گەڕاوە
هەردوو گەردەن بەندی یەك قەف زنجیرین
سەر نەووشتمان بەیەك خامە نووسراوە

چەم لە دەست دێ ؟ ئەی خۆشەویست نازانم !
دوو هێندەی تۆ ڕێگای عومرم بڕیوە
خۆت دەزانی چەندە شازاری گیانم
لەو ڕۆژەوەی یەکتریمان نابیوە

هەتا مابم هەر بۆلای تۆ دەنوازم
هەتا مابێ تۆی بزدی بەختیاریم
گەر بەندی یاسای کۆمەڵ بم ناچارم
وەرنا دانامرکێ گڵپەی دڵداریم

٥

# سکاڵا

نە کافەزی بۆ دەنێرم
نە بای شەماڵ رادە سپێرم

نە هەڵدەکێشم ئاخی سەرد
نە کەللەی سەر دەدەم لە بەرد

نە رۆژ یادی بەهار دەکەم
نە بەشەو شینی پار دەکەم

نە خەیاڵ نە بیرەوەی
هیچ نەما کشتی هەڵوەری

وەك گەڵای ئەم دارستانە
بەم وەرزی چلەی زستانە

درەختێکم رووتو بێ بەر
بەفری سپیم نیشتۆتە سەر

## وودمی دلداری

ئەو کاتەی کە نوزوسیت بۆم ( یا حیاتی )
ویستم گیانی خۆمت دەمێ لە جیاتی

ئەگەر من ژیانی تۆ بم تۆ چیم بی ؟
بەختیاری و ئاوات و دلداریم بی ! ؟

ئەم ووشانە هێند گوشراون ، سواون
وەك سکەی کۆن لە نرخا داشکاون

لە فەرهەنگی هەرزمانێ دەزانم
ووشێکی وا نایێتە سەر زمانم

بدرکێنی واتای ئەو جۆرە هەستە ،
کە لە سەدان دلداران یێك پێی مەستە ،

یێکی وەك من ، کە ئێستاکەی هەبوونی
لە تۆ پڕە و لێو ڕێژ بووە دەروونی

خوایە ، ووشەیێکی وا بێنە سەر زارم
نیدەمەوە پێی وەلامی نازدارم

هێشتا ئەو نووشتە پیرۆزەم لاماوە
کە وودمی ( بها حیاتی ) لێ نووسراوە

لە هەر کوێ بم ، بە رۆژ ، بەشەو ، لەگەڵمە
هەتا مابم ، ئاشقبەندی سەر دسە

٥

# لافاوی خۆشەویستی

ئاخ لە بۆ ئەو سەردەمە خۆشەی کەوەك فەسلی بەهاربوو
ئەو دەمانەی جۆشی دڵ لافاوی دەریای بێ کنار بوو
دوو بە دوو تا ئەو پەڕی دنیای نیازمان لێ دیار بوو
کێ وەکو ئێمە بەبادەی خۆشەویستی نەشئەدار بوو !

گێژەنی خوێنمان بەرەو دوڕگەی تەلەسماوی دەبردین
هەر شەپۆلێکی هەتا ئاسمانی شین بەرزی دەکردین
هەر دەقیقەی پێکەوە سەد جارە دەژیاین‌و دەمردین

ئای لە بۆ ئەو چاوە ئەو خاڵانە ئەو لێوەبەتامەت
وای لە بۆ شلکەی لە باوەشنانی ئەو بەژنە نەمامەت
چەند بە ئەسپایی مەری پەنجەم دەخستە سەر شەمامەت
هیچ نەبوو باکم لە دنیادا مەگەر چاوت سەلامەت

کوا لە کوێن ئەی کاتەکانی پڕ لە شادی‌و بەختیاری ؟
کوانی کلپەی ئەو هەناسانەی بڵێسەی لێ دەباری ؟
کوانی نازی چاوی ؟ لە رزەی لێوی ؟ خەندەی پڕ بەزاری؟

تۆ لەوێ مایتەوە من لێرە هەموو دەم چاوەڕێتم
هەر هەمان دلدارەکەی جارانی سەد حەلقە لە گوێتم
گەر دەزانی چەندە من موشتاقی خاکی ژێری پێتم
شێت دەبم وەك پێم دەلێی جارجار خەونێکی شەوێتم

ڕۆژ نەبوو پەیمانی دلداری لەگەڵ یێکتر نەبەستین
کەی دەبوو تاوێك بەلێشاوی خرۆشانمان بوەستین
کێ هەبوو جارێك بمانبینێو نەزانێ خۆشەویستین ؟

لەو هەموو ئاواتی عومری خۆشەویستی‌ی سەوز و سوورە
چی بەجێ ماوە بەغەیرەز ئەم نیازەی دوور بە دوورە
گەر خەتا بارم لە ناچاریمە توخوا لێم ببوورە
سەد ئەوەندەی تۆ پەرێشانو هەواڵم ناگزوورە

لەو سەری دنیا شەوە دەنگت ببیسم بەختیارم
وەك دلۆپەی ئاگرین دەرژێتە نێو خوێنو دەمارم
سەد هەزار ئەستێرە هەلدەکشێن لە ئاسۆی یادگارم

# یادێکی کۆن

ئێستاش هەر چەند سەیرم کەن دوو چاوی کەش
یان بنوارمە بالای بەرزو پرچی رەش

گلپەی ئاگر بەردەبێتە هەناوم
لافاو دەکەن سەر چاوەی هەر دوو چاوم

تا دەشمرم ، بریقەی دوو چاوی کەش
وەك برووسکەی هەوری شێوەی پرچی رەش

تاوی باران هەلدەرێژێ لە چاوم
گلپەی ئاگر بەردەداتە هەناوم

هەر تازەیە یادی یێکەم دلداریم
سارێژ نابێ بریني هەرزەكاريم

لە بیر ناکەم خۆشەویستیی ئەو جوانە
هەتا مردن لە نێو دلما میوانە

خوایە . . دەبێ . ئەویش ، ئەمەی هەوال بێ
تاکو مردن منی هەر لە خەیال بێ ؟

## بۆ جوانێکی کۆلێجی ئەدەبییات

دیمەشق – ساڵی ١٩٥٤

ئەو کچە جوانەی کە ناوی ( أمل )ە
دڵی دڵدارانی خستە زەلزەلە

ئاوەدان بێ جامیعەی سووری کەوا
وەك بەهەشتێکە لە سایەی ئەو مەلە

هەر لە دەرگای دەرەوە دەربکەوێ
دێتە گوێ هاوارو بانگی ( یا هلا )

وەك پەریزادە ئەویش هەنگاو دەنێ
خاکی ژێر پێی دڵو چاوی کوڕ کەلە



ڕۆژەکێ دەیخوێندەوە دیوانەکەی
شعری ( شێللی ) کە جریوەی بلبلە

چوومە لای دەستم درێژ کرد بۆ دەسی
پێی گوتم لاکەوە دەستت چەپەڵە

زۆری لێ ترسام ئەوەی داگیر بێ
بۆ هەلاتن وەکو دز کەوتمە پەلە

جارێ وا رووبەدا لە باخچەی جامە
تاک و تەنیا بوو لە بن پێك دار گولا

چاکەتی سەوزی ، سەوز بوو وەك گەلا
روومەتی ، واتێگەییم تازە گولە

چووم دەمم بۆی برد کەماچ و بۆنی کەم
چۆن بزانم ئەو گولە رووی ئەمەلە !

پێی گوت ، وادیارە ناخۆشی دەکەی
ریزی خۆت بگرە ، بەسە ، مەیکە ملە

زوو گوتم : پاردۆن ، لەلام وابوو گولی
تۆ بەبێ ئیتر ، بیوورە لەمەلە
(۱)
پێکەنی و فەرمووی کەواتا ( ماعلێش )
ئەی خودا ، ئەم قسەیەم چەند بەدڵە

•

ئەی خودا ئەم کچە چەند شیرین خوو
چەند پەری روو و خانمێکی جەنتلە

---

۱ ــ ماعلیش : (ماعەلێش) ، واتا : قەیدی ناکا •

چەندە روو خۆشە لەگەڵ هاوپۆلەکان
بەس لەگەڵ من بۆچی وا فیزی زلە! ؟

نازەنین مەیلێ بکە دلداری تۆم
چاو بەفرمێسك و هەناسەم دووکەڵە

گوێ گرە ئاخ‌و نزای رۆژو شەوم
پێشکەشی تۆم کردووە ئەم غەزەلە

# پێکەنە

پێکەنەو گیانە کەمەك بۆم پێکەنە
پێکەنە ریشەی کەساسیم هەلکەنە

پێکەنە دنیام لە بۆ پێدەکەنێ
ئەم دلەی ماتو کزەم رادەچەنێ
خۆی وەکو جاران لە ژێر پێتا دەنێ
پێکەنە ئاواتی ژینم پێکەنە

پێکەنە پەردەی زوێری لابەرە
بیخەوە کالان دەمەك ئەو خەنجەرە
نارەوایە ئەو هەموو دەردی سەرە
پێکەنە خاتوونە زینم پێکەنە

پێکەنە لێم زیز مەبە ئەی نازەنین
کەی دلی تۆ بۆتە جێگای خەشمو قین
لێوەکانت جوانە بۆیان پێکەنین
پێکەنە ئەی خەمرەوینم پێکەنە

پێکەنە توخوا دەسا بۆم پێکەنە
پێکەنە ریشەی کەساسیم هەلکەنە

# بـۆ جـوانێك (١)

بەیرووت ـ ساڵی ١٩٥٤

ئەی کچی جـوان ، ئەی تاقانە هیوای دڵ
زەردەخەنەت پشکووتنی خونچەی گـــوڵ

ســەیرم بکــە ، بـۆم پێکەنە پـڕ بـەدەم
مەســتم بکــە ، شێتم بکە بـە ئاســتەم :

بۆم بکەوە ، دەرگای بەهەشت دەرگای بـاخ
ئەو دوو سێوەی دڵ بەحەزرەتیان پڕداخ ،

ئەو دوو مەمەی دەست دەکێشن بـۆ یاری
یان دوو نـاز بالیفۆکەی خوای دڵـداری

باتێر بـۆن کەم ، هەڵیانمژم وەك منداڵ
لە ســەر سینەت بێهۆش کەوم لاڵو پـاڵ

خـۆشـەویسـتم توخوا دڵـم ســەشکێنـە
دەخیلت بم مەمکـۆڵـەت بـۆ لام بێنـە

---

١ ـ لە پەنجاکاندا لە گۆڤاری ( هەتاو ) دا بڵاوکراوتەوە .

## خەونێکی خۆش

دیمەشق ـ ١٩٥٧

ماچێك لەم دوو لێوەی پڕت
بۆنێك لەم بن مەمکەی خڕت
بەناز بڕۆ
وەك ئاوازەی فۆکسترۆ
وەك شنەی با
پێ دانێ سەر باری ڕۆمبا
خێرا وەرە نێو باوەشم
ئەی ئاواتم ، بەختم ، بەشم
دەستەکانت بکە ملم
مەمکۆلەت دانێ سەر دڵم
سادەی
ئۆخەی
ئۆخەی
ئۆخەخەخەخە ... ی .

o

نە بێهۆشی ،
نە سەرخۆشی
خەونێکی خۆش و شیرین بوو
بووکی خەونەکەش ( هێلین ) بوو .

## (سەرەنجامی تاریك)

«لە نێو هەندێك لە كۆمەڵانی مرۆڤدا ، نەریتێكی ناهەموار هەبو
رەنگە بێ كەم و زۆریش مابێت ـ كە دەبوایە كچ (دۆتە ـ مارەیی
ی هەبوایەو پێشكەش بە زاوای كردبا تا بنچینەی ژیانی تازەیان
پێوە دابمەزرێنی ·
دیارە ، ئەم نەریتە ناهەموارە · لە نێو چینی هەژارەكانی
كۆمەڵەكەدا زۆر جاران ئەنجامی گەلێك ناهەموارتر
بەرپا دەكرد · »

### یادگاریكی دیمەشق ـ ١٩٥٧

حەڤدە ساڵەو نەزانو سادەو خاوە
نەشارەزای دنیای پڕ بەندو باوە

وەك گولالە سوورەی باخی بەهەشتی
پێدەكەنی بۆجوانیی‌دەورو پشتی

شۆخ و شەنگە شێوەی فریشتەی پاکە
سەد مەخابن ئینسانەو بەندی خاکە

دەبێ بخوادەبێ خۆی جوان بپۆشێ
تابتوانێ نازی گران بفرۆشێ

تازە کچە ، گەلێك شتی پێویستە
لەو شتانەی لای ئافرەت خۆشەویستە

وەك ئەو خشلەی کە بەناز دێتەلەرزە
هەر قلێکی پرشنگی هەزار تەرزە !

پۆشاکی جوان کەرستەی خۆرێکخستن
عەتروو بۆنیوەك جادوودڵ دەبەستن

زۆر لە هووردە شتی دیکەی جوانکاری
کە دەردەخەن پتر شێوەی نازداری



بەرامبەری ماڵیان کچی دەوڵەمەند
سەیریچۆن خۆی سازداوەبۆ زەماوەند

سەر تا پەنجەی پۆشتەی مۆدیلی تازە
کە هەر جوانێك لە بۆی ئاواتە خوازە

گەردەوانەو گوڵی سەر سینگ مرواری
گوارەی ئەڵماس بۆی هاتوە بەدیاری

عەترو بۆنو ماکیاجی هی پاریسە
گوڵدان گەلێك نایابەهەر گوڵ سیسە

٥

کچەی نەشمیل دەیبینی گشت ئەمانە
رایدەپێچا خەیاڵاتی شێتانە

دەکشایەوە بۆ تێوژووری ساردو سڕ
دایدەکەنی جلو بەرگی کۆن و شڕ

ماتو سەرسام، لە ئاوێنەی قەد دیوار
دەینواڕییە نەخشی جوانی کردگار

برۆی باریك بژانگی تیژ، چاوی شین
پرچی درێژ زەردو نەرمو ئاوریشمین

روومەتی ئاڵ، لووتیبڵند، لێوی پڕ
سینگی سپی، دوو شەمامەی قیتو خڕ

قەدی باریك لەشو لاری جوانو رێك
پێو بەلەکی لووستر لەهی پەیکەرێك

دەست و پەنجەو باسك ئەفرۆدیتانە
دەق بتێکە جێی شانازی بتخانە

بت ! بت نیە ، خوا کچە، جێی تۆلمپە ![1]
!؟ زەیۆس ئەی خوای برووسکان بۆ خۆت بمبە

کێ هێندەی من تەڕو تازەو شیرینە !
کام جوان وەك من شاکاری پەنجەی ژینە ! ؛؛

ئەی شۆخ کەسێك نیە هێندەی تۆ جوان بێ
با پەری بێ ، یان فریشتەی ئاسمان بێ ،

بە دوورکەوە لە ناوێنەی قەد دیوار
شێتت نەکا سیحری جوانیی لەشو لار ؛

شەرتو پەیمان ، زمانی لووس ، قسەی خۆش
باوەشی توند ، هەناسەی گەرم، نەشوەی کۆش،

یەك لەحزەیەو پەشیمانیی لە دوایە
ئیتر هەرگیز ئاواتت بەجێ نایە

٣

نە کوڕ نە کچ نە ماڵ نە دڵداری گیان
هەر تاریکیو هەر تەنیاییو دەردوژان

دەسا ئەی جوان، شەیتانی ئارەزووی رەش
بە لەعنەت کەو نە دۆڕێنی خونچەی گەش

چاوەنوارییە ، سبەی ، بەڵکو هێوارە،
کوڕێکی لاو ، با هەژار بێ‌و بێچارە

دێتە پێشت ، دڵ دەخاتە تێو دەستت
گەر نەشتوانێ جێی هێنێ کشت مەبەستت

خۆشەویستی و ئارەقەی تێوچەوانی
هاناهەن بۆ سەر بەرزی‌و کامەرانی

٥

---

١ ـ کێوی ئۆلمپ مەڵبەندی خواکانی یۆنانی کۆن بوە .

# ئەی یارەکەم

ئەی یارەکەم
ئەی یارەکەی نازدارەکەم
دلنەرمەکەی جارجارەکەم
من ئەو برینی پارەکەم
کەی چارەکەم ؟
چارەی چیە زامدارە دڵ
غەمخوارە دڵ غەمبارە دڵ
بێزارە دڵ هێندە زارە دڵ
رابوردیە ئەمجارە دڵ
تیمارەکەم :
تیمارەکەم ماچی دەمە
یێک لەحزە مەیلێکی کەمە
یان یێک هەناسە بۆی مەمە
بۆ ئەم برینە مەلحەمە

o

ئەی یارەکەم
توخوا برینی پارەکەم
کەی چارەکەم ؟ !

## لــــە شەوی بەڕیکەوتنێکدا •

بـەیـانــی دوور دەڕۆم ، دوور دەڕۆم بـەیـانــی
ساڵێکم پــێ دەچــێ ، دوازدە مانگـ ، دەیزانی ! ؟

چــۆن بــێ‌ی تــــۆ بتوانــم هەڵبکەم ئــەو ســاڵــە
بــڕواکــە ، ژیــانــی ئــەو ســاڵــەم لاتــاڵــە

لــەو شوێنەی دوور وولا ت، کێ بێتە رابــەرم ؟
ماندووبــم کــــێ رانــی بنێتــە ژێــر ســـەرم ؟

فــەرمووتــە دلــــداری ، هێــز دەری دلـــداره !
دوو چــاوت لـــەو ێــوه ، پڕشنگیان لێم دیــاره ؟ !

کــەواتــا ، بــەیــانــی ، کـــە دەڕواجــێ‌ی رازت
نــەڕێــژی فرمێسکــی ، دوو چـــاوی پڕ نـــازت

بــەیانی لەگەڵ یێك کــەدەبین دەسـت لـــەمـــل
نەبینم لەرزەی لێــو ، نــەم پێکــی خورپــەی دڵ

٥

# برگەێیك لە هەڵبەستێكی

(جبران خلیل جبرن)

گەر (سماد)م هاتە لاتــان خزمەكــان
كــردی پسیاری كــوڕێكــی ماتەمین
پــێی بڵێن ڕۆژانــی لێكتر دابــڕان
بوو بە ئاو بۆ ئەم دەروونەی ئاگرین
خۆڵەمێشن ئێستە كشــت پشكۆیەكان
هەم فەرامۆشی هەموو ئــەشكی سڕین

گــەر زوێر بوو ئێوە بــێ ئارام مەبن
وەربگریــێ بــن لــەگەڵیا میهرەبــان
پــڕ بەدەم گەر پێكەنی سەرسام نەبن
هــەر وهایە كــارو پیشــەی عاشقان



## شاعری بێدەنگ

تامەستم نەکا بادەی ئاڵ
نەکەومەبن دەریاری خەیاڵ
ناتوانم لە مەرجان و دوڕ
تووڕەگەی شیعرم بکەم پڕ

تا نەگەڕێ گیانم وەك هەنگ
تام نەکا شیرەی خونچەی تەنگ
چۆن لە هەنگوینی سپیو خەست
لێو ڕێژ دەبێ شانەی هەڵبەست ! ؟

تا دانەڕزێ پشتی رووتم
خوێن نەڕژێ لە دەم و لووتم
گیانم داخ نەکا زۆر داری
هەڵناچنێ شیعری رزگاری

تا دوای سەهۆڵبەنەی زستان
رەنگار نەبێ شاخی کوێستان
چۆن سەرچاوەی بەهرەی رەوان
دەتەقێ پڕ لە شیعری جوان

دەسا ئەی بادەی دڵداری
ئەی ئێشی داخی زۆر داری
ئەی لووتکەی شاخی سەد رەنگم
بۆ چ هێشتا ماتو دڵتەنگم !
بۆچی هەر لاڵە زمانم
نەماوە جۆشی جارانم ؟ !



## دیمەنێکی بەهار

چێشتەنگاوێك بە تەنیایی
بە کوێ چەمێکدا دەگەڕام
پێم دادەنا بە ئەسپایی
دەمنواڕی بۆ ئەم لاو ئەو لام

لقی بەرزی درەختەکان
سەوزێکی مەیلەو زێڕین بوون
گەڵای تەڕ دەدرەو شانەوە
یەکپارچە پیرۆزەی شین بوون

کەروێشکەی دەکرد سەوزە گیا
شەماڵ پەرچەمی دادێنا
پرشنگی یێك قەترەی خوناو
هەزار گەوهەری دەهێنا

حاجیلەو کولیکەی نیسان
سەر گەرمی نەشئەی بەهار بوون
کۆمەڵ کۆمەڵ هەڵدە پەڕین
تا چاو بڕی دەکرد دیار بوون

بە دیتنی دیمەنی وا ،
گەر شاعیرێش نەبێ نیسان
دڵی پڕ دەبێ لە شادی
هەڵبەستی دێتە سەر لێوان

خۆزیا نەختێکم هەبوایە
لە بەهرەی هونەری « مۆنێە » ١
ڕەنگی ئەو دیمەنەم دەڕشت
تاکو تا هەتا بمێنێ ٠



---

١ ـ مۆنێە : Monet : یەکێکە لە هونەرمەندە گەورەکانی فەرەنسا و ، پێشڕەوی ڕێبازی ئینتباعی ـ ئیمپرێشنیزم بوە و زۆر بایەخی بەرەنگ داوە ٠

## کەسک و سوور

هەموو رۆژێکی بەهاران
کە تاو تاو دەباری باران

کە دەردەکەوی شۆخ و شەنگ
جوان بووکی ژێر ئاڵای حەوت رەنگ

سەیری دەکەم مەست و دڵشاد
پەرواز دەکا گیانی ئازاد

دەمەوێ وەك جاری جاران
ڕاکەم و تەڕم کا باران

▪

ئەی کەسک و سوورەکەی بەهار
بە بیرت دی دەهات بە غار

منداڵێك تەمەن ، هەشت ، نۆ ، ساڵ
مەستی نەشئەی خەون و خەیاڵ ؟

ئێستاش ئەو دڵ منداڵە هەر
پیری نەکردوە دەردی سەر

هەموو رۆژێکێ بەهاران
کە تاو تاو دەبارێ باران

دەیەوێ وەك جاری جاران
راکات و تەڕی کا باران

٥٠

# یادێکی رابردوو

هەر چەندە دێتەوە بیرم زەمانی رابردوو
شەوانی زستان ، سەردەمی تەمەنی منالیم
کە دادەنیشتین لە دەورەی ئاگری داربەڕوو
کە بەکیان لەگەڵ ئاوازی شمشاڵ ژەن دەنالیم
دڵم دەست دەکا بەلێدان ، خوێنم دێتەوە جۆشن
گوێم پڕ دەبێ لە هەزار سروودی ناسك و خۆش

شەوانی زستان ، شەوانی درێژی کوردستان
لە مانگی کانوون و رەشەمەو رێ بەندان
کە بەفر چۆك دەخاتە سەر سینگی چەمەنستان
کە پڕ بەچاوی ئاسمان لافاو دەکا گریان
لە ئاگردانی ماڵە کورد کڵپە دەکا ئاگر
بەڕوو دەتەقی و بۆ نێوکۆشن تێ هەڵدەدا پەنگر

سیرەی سەماوار ، دەلێلێ و دەلۆلۆی لاوکبێژ
لاوکی بۆزبەکت و چەتۆو دەروێشی عەدلەخان
بەسوێ دەهێننەوە زام و برینی باشن سارێژ
هەتا بەیانی گەرم دەکەن ئاهەنگی دیوەخان
بەلێ هەر ئەمەیە کاری چیرۆکی دڵداری
رووداوی زەمانی رمبازی و دەبدەبەی سواری

ئـەم لاو کـانە تۆمارن ، مێژووی ئـەم میللەتەن
هـەندێکیان وەکـو ئـاوازەی ژیانـی ئـازادیـن
لــە کاتێکا قەوماون کــە سەربەست بوە وەتەن
هـەندێکیشـیان بەراسـتی کارەسـاتی بێدادیـن
چەتۆ لـەرێی ئـەم خاکەدا بـوو سـەری دانـــا
دەرویش بووبـە شەهیدی عشقی عەدوولـــە خانا

حەیـران ، حـەیرانی دزەییان چریکەی دڵـداری
ئـاگر دەخـاتەوە کـوورەی دەروونـی پیاوی پیر
جـاحێل دەکـــا بــە شـێتی خـەیاڵی نـازداری
کــە جۆتە شـەمامەی بـاخەڵی ـ دەخاتەوە بیر
لەکوێی ئەی دەشتی قەراجی ئەیهۆبەی رەشماڵان؟
لەکوێن ئەی شەنگەبێریەکان ئەی پۆلی چاوکاڵان ؟

ئاخ بۆ فیقەی زورنا رمبەی دهـۆل زرەی کەمبەرە
نزمی شـەمامەو چارۆگەو حەیرانی سـەر چیایـی
کـێ دەتوانێ بڵـی : مـامەی پیر وا هەڵمەپەڕە !
بـۆچ کەس هەیە لەو کاتەدا لە خۆی نەبی بایـی ؟
پیاو هــەتا دەمـری هــەتا دەچێتە بـن خـــاکـی
هەر خۆی دەکـا بەقوربانی کـچ بە کۆیلەی داکـی

منیش تـــا رۆژی مردن تـــا دەمبەنە گۆڕسـتان
قـەت لــــە بیرناکـەم ژیانی زەمـانی رابـردوو
لـــە دڵدا هەر گـەرم دەبێ ئـاهەنگی کوردسـتان
لـە گوێمدا هەر بەرز دەبێ دووا بەندی تایووهوو

٥

# کۆچی تەمەنی لاوی

«لەتەمەنی لاویدا ئەوەندە مەستی ئاوات و خەیالاتی رەنگاو ڕەنگ بووم کە هەموو شەوێکم لەلا رۆژو هەموو رۆژێکم لەلا بەهار بوو ٠
جیهانی داهاتووم وەك بەهەشتێکی تەلەسماوی دەهاتە بەرچاوان، بەلام ، کە جۆش و گوڕی لاوێتی دامرکایەوە و سەرابی رەنگاو ڕەنگ تاوایەوە ، جگە لەهەورازێکی سەخت و پڕ لە مەترسی هیچی دیکەم نەدیت لەسەر چەقی رێگەمدا ٠»

گەیشتە چل ئیمسالە کە تەمەنم
چل سالی خشت ، چل سالی خشت و رەبەق
چەند زوو کوژایەوە بلێسەکەی شەفەق
رۆییشت ئیتر منالانە پێکەنم

چەند زوو تێکشکا بلەوری رەنگاو ڕەنگ
چەند زوو رەویەوە سەرابی خەو بینین
ئیتر نەجۆش نەمەستی نەهەلپەڕین
کۆرپەی تەمەن خرایە ژێر گل و سەنگ

ئەی عومری کورتی لاوی ، مەخابنە
دێیت و دەڕۆی هەروەك شنەی بەیان
تەڕ نابی لێو لە شەربەتاوی ژیان
بۆچ هێندە زوو بۆچ ئەم حوکمی مردنە

کوا خەونی خۆش ؟ کوانی پەیکەری ئاوات ؟
کوا جامە نەشئە بەخشەکەی سەربەستی ؟
کوا ئەو بتەی دەمویست دانێمە بەردەستی —
خونچەی دڵم پێش هەڵوەرین ؟ هەیهات ...

دڵی شاعر بەچەشنی گوڵی بەهار
تینووی دڵۆپی شەونمی جوانی‌یە
بەحەزرەتی یێك قوم کامەرانی‌یە
لە لێوی ژین ، لەنازی چاوی یار

کەچی جارێك یێك دڵۆپە دڵشادی
نەنیشتە سەر پەڕی ژاکاوی ئەم گوڵە
نەکەوت بەگیانی تەزیوی ئەم دڵە
تاوێك نگای خۆرەتاوی ئازادی

هەمیشە بەندی داوی پێڕەوی سەخبت
قەفی زنجیری دیلی لەگەردەنا
تیری ستەم چەسپی جەرگی کون کونا
چاو دەگەڕا لە دوای تروسکەیی بەخت

بێهوودە بوو تەکانو پەلەکوتێم
ئازاد نەبوو لە قەفقەفی زنجیر گەردەنم
سارێژ نەبوو زامی جەرگی کون کونم
توندتر بوو بەندی گرانی دەستو پێم

بەڵام هیوا ـ زادەی تەمەنی لاوی
پڕشنگی گیانی مەستی تەووژمی خوێن
پا بەند نەبوو قەت بە داوی کاتو شوێن
بۆ ژیانی سبەی ، دەینا هەنگاوی :

بۆ ژیانێك کە سەر تا سەر تەمەنی
هەر لاوی‌یەو تەزووی خۆشەویستی‌یە
بەختیاری‌و خەیاڵاتی مەستی یە
ژیانێك کە هەزار ڕەنگە دیمەنی

گەیشتە چل ئیمساڵە کە تەمەنم
چەند زوو ڕەویەوە سەرابی ئاواتم
منی ئینسان ، منی بێ دەسەڵاتم
بۆ کۆچی لاوی‌یە فرمێسك‌و شیوەنم ؟

٥

# بـای ده فلـوس رۆن

دیمەنێکی راستی کۆمەڵایەتی : زستانی ـ ١٩٦٠

چلـەی زستان
بەفـرو باران ،

گۆشتی ناسـكو جاوی کـۆن
ده فلوسو جامەکی فافـۆن

ـ : بۆچ دەگری کچە بچکۆڵە :
لێیدای ئەم هەتیوە زۆڵە ؟

ـ : نا ، مامەکە ، دەگریم بۆ رۆن
کەس نایدا بای ده فلووسی کـۆن .

ـ : بای ده فلـووس رۆن ؟
حەوت کەس دەیکەن بەچیو دەیخۆن ؟

هاوارە خـوای ئـەرزو ئاسـمان
لەم کۆڵیتە حەوت سـەر خێـزان
رووتو قووت ، برسـیو تامەزرۆن
چاوەنـواڕی رەحمـەتی تـۆن ،
بـای ده فلـووس ، رۆن

## بۆ شاری هەولێر

هەولێر ئەی شارەکەی جوانم
شانۆی هەزاران داستانم

هێلانەی پێ گەیشتنم
سەر چاوەی تێ گەیشتنم

مەڵبەندی تەمەنی لاویم
مەیدانی هەزار پڕتاویم

من ئەگەر چی شارنشین نیم
پیاوەکی لادێ ییو گوندیم

بەڵام وەك نیشانم داوە
پەروەردەی تۆیە ئەم پیاوە

بۆیێ ئەی شاری سۆرانی
خۆی بە کوڕی تۆ دەزانی

٥

ئەی بەهرەی شیعری رەوانم
ئەمجارە بۆ شاری جوانم

دەمەوێ گۆرانی بێژ بم
گۆشی مرواری هەڵرێژ بم

سا لەگەنجینەی مێژووی کۆن
بۆم بینە شعری گۆناو کۆن

بۆ چوار هەزار ساڵ بنوارە
عومری درێژی ئەم شارە

کام شارەك لە هاو تەمەنی
تاکو ئێستا پێ دەکەنی ؟

کام شاری کۆن لەم جهانە
تاکو ئێستا ئاوەدانە ؟

شووشەو ئەستەخرو نەینەوا
بابلو کار تاجەو تەروا

گشتیان دەمێکە وێرانەن
وەك حیکایەتو ئەفسانەن

ئەی مەڵبەندی هەرزەکاریم
هۆی زانین و خوێندەواریم

کام خشت و کام بەردی نووسراو
ناوی تۆ ناخاتە بەرچاو ؟

لــــه وەختێکـدا کـــــه نـــەیەوا
پـایەتەختێـك بـــوو بـــا هـــەوا

تۆش وەکو ئـەو جوانو قـۆز بووی
لـه ئـەویش پتـر پیرۆز بـووی

گـەرچی ژێر دەسـتی ئاشوور بووی
لای میدەکـان پـڕ لـه نـوور بووی

بۆیـێ کـــەیخسـرۆ بـەمـەردی
ئـــازادو رزگــــاری کـــردی

دایمەزرانـد لـــه جـێی بتخانـــه
پـەرستە شگـاهـــی ئـاریـانـه

بـوویتەوە شـــاری ( ئـــاهـۆرا )
ـ کـەخوای ئـاریای خوارو ژووره ـ

ئیتر هــــەر پیرۆزو پــاك بـــووی
هــەرجێی زانسـت و رۆناك بـووی

تـانەتـەوەی کـــورد بـــەگشـــتی
وازیـــان هێنـا لـــــه زەردەشـتی

روویـــان کـــردە قیبلـەی تـــازە
کـــەوا لـــــه دەشـتی حیجـازە

لەو وەختەوەش ئەی شاری جوان
هەر شاریت و هەر ئاوەدان

هەر قوتابخانەی زانستی
هەواری کوردی سەربەستی

تەنانەت لەشکری تەتەر
کە خۆرهەڵاتی گرتە بەر

نەیتوانیوە تۆ داگیرکا
ئافرەت و پیاوت زنجیرکا

ئەی شاری سوڵتان ( مظفر )
سوڵتانی ئازاو دادپەروەر

منی دڵسۆزی سوڵتانت
دەگەڕێم جادەو کۆڵانت

نابینم بۆ یادگاری
نیشانێکی وەفارداری

چەند بەلای گۆڕی رادەبرم
لە شەرمەزارییان دەمرم

بۆچ ئەم گومبەتە رووخاوە
هەر وێرانەبێ و کەلاوە ؟

نە دیوارێکی لە مەڕمەڕ
نە گولزارێکی جوانو تەڕ ؟ !

بەڵام ئەی گەورە سولتانم
جێی نازی رابەخانم

کەی پێویستی بۆ یادگار
بە گۆڕو گومبەتو دیوار ؟ !

تۆ کە هێندە پا یەداری
هەتا مێژوو ماهێ دیاری •

دیاری لە سەد کتێبی کۆن
کە پڕ لە ستایشی تۆن

چونکە نووسەرو دانەریان ،
سەر چاوەی بەهرەو هونەریان

قوتابخانەکەی هەولێر بوو
کە هەزارانی لێ فێر بوو

چەند داناو چەند مێژوو زانی
وەك ( مستوفی ) و ( خەلەکانی )

پەروەردەی ئەم هەواو خاکەن
تێر ئاوی ئەم ئاوە پاکەن ! !

ئێستاش منارەکەی چۆلی
دەگری بۆ بەختی کلۆلی

بۆ رەنگی هەلبزرکاوی
سەرو تۆپەلی رووخاوی

بۆ هەرەتی شۆخو شەنگی
نەخشو نگاری سەد رەنگی

بۆ باغو حەوشو حەساری
ژوورو هەیوانی هەزاری

بەلام ئەی سولتانی گەورە
لای من زیندووەئەو دەورە

هێشتا ئەم منارە رووتە
لە گەڵ تاقی ئاسمان جووتە

وەك دەستێکە ، چرا هەلگر
بۆ یادگاری تۆی نەمر



ئیتر ئەی شاری هەولێرم
بە خودای گەورەت دەسپێرم

هەر خۆشو هەر ئاوەدان بی
رۆناكو پێشکەوتوو و جوان بی

## مەڵبەندی ڕۆڵەی نەبەرد بێ
## جێی نازی نەتەوەی کوردبێ (١)

٥

---

١ ـ ئەم هەڵبەستە ، لە کۆتایی شەستەکاندا لە یێکەم ژمارەی گۆڤاری (هەولێر) دا بڵاو کراوتەوە . کومبەتی (سوڵتان موزەففەر) و مارەی چۆلی لە پاشاندا چاك کراونەتەوە .
(رابعە خاتوون) یش ، خێزانی ئەو بووەو خوشکی (سوڵتان صلاح الدین) بووە .

# شوێنەواری بەعلەبەك ـ لە لوبنان

ـ ١ ـ سالی: ١٩٥٧

قـەڵای بەعلەبەك ٠ ئـەی ئارامگاهی بەعـل‌و چۆپیتـەر
کێ تۆی دروست کرد ، خواکانی رۆمان یا دەستی بەشەر ؟

ئەی هونەری جوان ، ئەی باخی پڕ لە گوڵی جۆراو جـۆر
چەند هەزار ساڵە دەدرەوشـێیەوە بەرامبـەر بەخـۆر ؟

چەند هەزار ساڵە ئەو هـەموو نەخش‌و دەستکردە ووردە
هەڵدەگرن بـۆ مان رازی هەزاران سـەرو سـەربردە ! ؟



## ٢ ـ حـەوزی ئیمپـراتـۆر

حەوزی ئیمپراتۆر ، دیوار لە مەڕ مەڕ،سەر چاوەی جوانی
هەنگـوینی شـانـەو مێـوەی درەختی فەننـی رۆمـانی

جاران ئەم حەوزە پڕ دەبوو لە ئاو بۆ مەلەوانی
خۆیان تێ دەخست دەستە بە دەستە کچی ڕۆمانی

ئەم حەوزە جوانە ، ئێستا وێران و ووشك و بێ ئاوە
نە گوڵ نەخونچە ، نە بنەوشەی مۆر نەیێك لاولاوە

دەڕازێننەوە باڵای شیرینی ، نەفرینی سەوز
دیارە و لە سەریا پۆل پۆل کچانی ڕۆمان بدەن گەوز



## ٣ـ نەخشی ڤینۆس

ئەی ڤینۆسی شۆخ ، خوا ژنی جوانی، دایکی دڵداری
سەرت بڵند کەو چاوت هەڵێنە ، بەس چاوەنواڕی

نازدارەکانی ڕۆمان نەماون بوون بە ئەفسانە
قەڵای بەعلەبەك ، عەرشی چۆپیتەر تەرت و وێرانە

منم دانیشتووم ، لە نێو ئەم حەوزەی دیوار لە مەڕمەڕ
چەشنی سەوداسەر دەگەڕێم بە دووای شوێنی ڕانی تەڕ

لێوم خستۆتە سەر لێوەکانت بۆچ هەست ناکەی پێم
بۆ سەیرم ناکەی بەغەمزەی چاوان ناپرسی من کێم ؟

من کێم !؟ کۆیلەی تۆم بەرەو هەیوان و تەختی ئیمپراتور
وەستاوم لەگەڵ یادی رابردوو و خەیاڵاتی زۆر .



## ٤ - پەیکەری شێران

ئایا پەیکەرە ! بەردی بێ گیانە ! پلوسکەی ئاوە !
یاخود هەر شێرەو بۆ پاسی ئێرە هەڵتوتڕکاوە ! ؟

ئەی شێری بەسام ، ناوێرم کەلێک بێمە بەردەمت
نەک چەپۆک گیرکەی لە تەپڵی سەرم ، بمکەی بەژەمت

بەس پێم نیشاندە ، دەمی بەخوێن و گیرەی ئاسنی
کەمێک رووخۆش بەو دایمرکێنەوە گیانی دوژمنی

بەخوێنی ئینسان تەڕ نابێ دەمت وەک جاری جاران
چیتر لە بن گوێت نازرنگێتەوە قاقای نازداران

ئایا هەست ناکەی بەم دوو کچانەی سواری پشتت بوون!
یا چاوەنواڕی تەختی کردگاریکەی سەرنگوون ؟



## ٥ - شانۆی سەما

ئەم سەر ئەو سەری ، شانۆکەی سەما هەشت نۆ هەنگاوە
شەکلی هەشت کۆشەو بە بەردی سپی بەرد ڕێژ کراوە

کەوتۆتە بەردەم لۆجی تایبەتی گەورەی پایەدار
تا لە بەرچاویا لەشی نەرم و شل پێچ بخوا وەك مار

ئیمپراتۆر لەسەر تەختی زێڕیندا سەر دەهەژێنێ
کە زیوەی گیتار جوانەی سەماکەر هەڵدەفڕێنێ

لەبەر دەمیایە جوانترین دەستە کچی رۆمانی ،
دەورو پشتیشی پەڕژین ئاسایە ، ئەلقەی پیرانی



## ٦ – سەدای رابردوو

ئاوازەی گیتار ، سەدای گۆیندە ، سروەی سەماکەر
کە وەك پەپولە سووك هەڵدەفڕی لەم سەر بۆ ئەو سەر

فیقەی کەڕەنا رمبەی دەهۆڵی شەڕو سەرکەوتن
چرکەی پەیتوون و ترپەی سەربازان لە چوون و هاتن

منیان بردەوە چەرخی جۆلیۆسی گەورەو پایەدار
کام جۆلێوس!.ئەوەی سەری بۆ دەنواند دنیا ژوورو خوار

خۆزیا برادەر وازت دەهێناو دەڕۆییت بێ من
دەوەستام بەرەو جوانەی سەماکەر تا رۆژی مردن

## ٧ ـ هەیکەلی بەعل

هەیکەلی بەعل شەش ستوونەیە کشاوتە ئاسمان
پردەکەی سەریان ئایەتێکە بۆ هەلکۆلینی جوان

لێرەدا قەیسەر تاجی شاهانەی دەنایە سەری
ئێرە بوو قیبلە بۆ دادخواستن و بۆ پەنا بەری

ئەی پیری هەیکەل ، دەستم داوێنت ۰ کوانێ یارمەتی !
بەرەو مەزارگات مل کەچ وەستاوم سەر کۆت ، پاپەتی

بۆم جێ بە جێکە ، ئاواتم ، هیوام ، خواستم ، نیازم
دەستی یارمەتی گەر لە تۆ نەبێ لەکێ بیخوازم ؟



## ٨ ـ پەرستەشگای باخۆس

ئەی هونەری بەرز ئەی پەرستەشگای خوای شەرابی سوور
منیش وەك خەیام باخۆس پەرستم هاتووم لەرێی دوور

**جوانتری لە کنج ، کچی شازدە سال ، کچی یۆنانی**
**لە هێلینی شۆخ ، لە ئینۆسەکەی خوا ژنی جوانی**

